# { پێرست }

Contents

{ الْحَمْدُ للَّهِ الَّذِي لَهُ مَا فِي السَّمَوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا وَمَا تَحْتَ الثَّرَى، عَالِمِ الْغَيْبِ لَا يَعْزُبُ عَنْهُ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ فِي السَّمَوَاتِ وَلَا فِي الْأَرْضِ، يَعْلَمُ سِرَّ خَلْقِهِ وَجَهْرَهُمُ، وَيَعْلَمُ مَا يَكْسِبُونَ، نَحْمَدُهُ بِجَمِيعِ مَحَامِدِهِ، وَنَصِفُهُ بِمَا وَصَفَ بِهِ نَفْسَهُ، وَوَصَفَهُ بِهِ الرَّسُولُ، فَهُوَ اللَّهُ الرَّحْمَنُ الرَّحِيمُ، قَرِيبٌ، مُجِيبٌ، مُتَكَلِّمٌ قَائِلٌ، وشَاءٍ مُرِيدٌ، فَعَّالٌ لِمَا يُرِيدُ، الْأَوَّلُ قَبْلَ كِلِّ شَيْءٍ، وَالْآخِرُ بَعْدَ كِلِّ شَيْءٍ، لَهُ الْأَمْرُ مِنْ قَبْلُ وَمِنْ بَعْدُ وَلَهُ الْخَلْقُ وَالْأَمْرُ تَبَارَكَ اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ، وَلَهُ الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَى، يُسَبِّحُ لَهُ مَا فِي السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ، يَقْبِضُ وَيَبْسُطُ، وَيَتَكَلَّمُ، وَيَرْضَى وَيَسْخَطُ، وَيَغْضَبُ، وَيُحِبُّ، وَيَبْغَضُ، وَيَكْرَهُ، وَيَضْحَكُ، وَيَأْمُرُ وَيَنْهَى، ذُو الْوَجْهِ الْكَرِيمِ، والسَّمْعِ السَّمِيعِ والْبَصَرِ الْبَصِيرِ، وَالْكَلَامِ الْمُبِينِ، وَالْيَدَينِ وَالْقَبْضَتَينِ، وَالْقُدْرَةِ وَالسُّلْطَانِ وَالْعَظَمَةِ، وَالْعِلْمِ الْأَزَلِيِّ، لَمْ يَزَلْ كَذَلِكَ وَلَا يَزَالُ، اسْتَوَى عَلَى عَرْشِهِ فَبَانَ مِنْ خَلْقِهِ، لَا تَخْفَى عَلَيْهِ مِنْهُمْ خَافِيَةٌ، عِلْمُهُ بِهِمْ مُحِيطٌ، وَبَصَرُهُ فِيهِمْ نَافِذٌ، لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ، فَبِهَذَا الرَّبِ نُؤْمِنُ، وَإِيَّاهُ نَعْبُدُ، وَلَهُ نَصَّلي وَنَسْجُدُ، فَمَنْ قَصَدَ بِعِبَادَتِهِ إِلَى إِلَهٍ بِخَلَافِ هَذِهِ الصِّفَاتِ، فَإِنمَّا يَعْبُدُ غَيرَ اللَّهِ، وَلَيْسِ مَعْبُودُهُ بِإِلَهٍ، كُفْرَانَهُ لَا غُفْرَانَهُ، فَنَشْهَدُ أَنَّ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهِ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدَهُ وَرَسُولَهُ، اصْطَفَاهُ لِوَحْيِهِ، وَانْتَجَبَهُ لِرَسَالَتِهِ، وَاخْتَارَهُ مِنْ خَلْقِهِ لِخَلْقِهِ فَأَنْزَلَ عَلَيْهِ كَلَامَهَ الْمُبِينَ، وَكِتَابَهُ الْعَزِيزَ الَّذِي {لَا يَأْتِيهِ الْبَاطِلُ مِنْ بَيْنِ يَدَيْهِ وَلَا مِنْ خَلْفِهِ تَنْزِيلٌ مِنْ حَكِيمٍ حَمِيدٍ }

# پێشەکی

...... لەڕۆژگارێکی وەك ئەمڕۆدا کە تەواو شتەکان شێوێندراون لەخەڵکی بەجۆرێك کە کوفر بوە بەئیمان و ئیمان بوە بەکوفر، بیدعە بوە بەسونەت وسونەتیش بوە بەبیدعە لەلای خەڵکی، جا ئەو کەسەی کە دەستی گرتوە بەم ئیسلامەوە نامۆ دەبێت لەناو خەڵکیدا، وە ئەو کەسەشی دەستی گرتوە بەسونەتەوە نامۆ دەبێت لەناو موسڵمانان، ئەوەی دەمەوێت لەم پەڕاوەدا نقڵی بکەم بۆ خوشکان وبرایانی ئەهلی سونە، کە بەداخەوە دەبینین زۆربەیان لەگەڵ مامەڵە کردن لەگەڵ ئەهلی بیدەع وگومڕای، تەواو پێچەوانەی سەلەفن،ئەوەی نقڵی دەکەم هەڵوێستی سەلەفە بەرامبەر بیدعەو کەسانی موبتەدیع وەئەوانەشی لای موبتەدیع دائەنیشن، کە گرنگترین کردار بوە سەلەف ئیمان وعەقیدەی خۆیانیان پێ پاراستوە لە شوبهات وگومڕای، جا ئێمەش کە ئیدعای شوێنکەوتەی سەلەف دەکەین، دەبێت مامەڵەمان بەرامبەر بیدعەو خاوەنانی بیدەعە وەک سەلەف بێت تا ببینە شوێنکەوتەیەکی بەحەقی سەلەف، نەک تەنها ئیدیعای مەنهەجی سەلەف بکەین ولەولاشەوە لەگەڵ موبتەدیع وەك برابین .

# هەڵوێستی سەلەف بەرامبەر بیدعە

عوسمانی كوڕی حاضر دەڵێت :

وتم بە ابن عباس رضی الله عنه ئامۆژگاریم بكە فەرمووی : دامەزراوبە شوێن الاثر بكەوە وە ئاگات لە بیدعەبێت .

{ الابانه الكبری ٢١٢ }

أحمد كوڕی عبد الله كوڕی یونس دەڵێت :

پیاوێك بە سفیان الثوری وت وە منیش گوێم لێی بوو :
ئەی باوكی عبدالله ئامۆژگاریم بكە ؟
فەرمووی : ئاگاداری هەوا و ئارەزوو بە بیدعە ئاگاداری مشت ومڕ و دەمەقاڵێ بە ئاگاداری دەسەڵاتداران بە نزیك مەبەرەوە لێیان .

{ مسند ابن الجعد ١٨١٩ }

أبو إدريس الخولاني دەڵێت :

ئەگەر لە مزگەوتدا ئاگر ببینم نەتوانم بیکوژێنمەوە خۆشەویسترە لەلام کە بیدعەیەك ببینم لە مزگەوتدا نەتوانم بیگۆڕم.

{ كتاب السنة للمروزي ٩٩ }

ئیمامی مجاهد :

لە تەفسیری ئایەتی [ وَلَا تَتَّبِعُوا السُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَنْ سَبِيلِهِ ]

{ النعام ١٥٣ } دەڵێت : واتە : بەدوای بیدعە و گومان مەکەوە

{ كتاب السنة للمروزي صـ٦٦ }

ابن عون لەکاتی سەرەمەرگیدا ئەی فەرموو :

سوننەت سوننەت ئاگاداربن و وریای بیدعە بن هەتا مرد .

{ شرح السنه ١٢٦ }

شريح دەڵێت :

شوێنکەوتەبەو بیدعە مەکە تۆ هەرگیز گومڕا نابیت تا دەستت بە ئەسەرەوە گرتبێت .

{ سنن الدارمی }

ابن عباس دەڵێت :

ڕق لێبوو ترین شت لەلای الله تعالی بیدعەیە .

{ السنة للمروزي }

أبو بكر صديق رضى الله عنه :

لەوتاری بوون بەخەلیفەی دا فەرمووی : ئەی خەڵکینە من شوێنکەوتەی قورئان وسونەتم، وبیدعەچی نیم ئەگەر کاری باشم کرد یارمەتیم بدەن وە ئەگەر لام دا ڕاستم بکەنەوە.

{ الموطأ ١ / ١٦١ }

عمر کوڕی الخطاب دەڵێت :

خۆتان بپارێزن لە بیروڕا لەدینەکەتاندا .

سحنون دەڵێت : واتە بیدعە

{ الاعتصام للشاطبی ١ / ١٣٤ }

عبدالله کوڕی مسعود دەڵێت :

شوێنکەوتەی پاشماوەو کارەکانمان بن بیدعە مەکەن ئیتر بەستانە.

{ الزهد لوکیع ٣١٥ }

ابن عباس دەڵێت :

هیچساڵێک نایەت بەسەر خەڵکیدا ئیلا بیدعەیەک دادەهێنن و سونەتێك دەمرێنن هەتاوەکوو بیدعە زیندوو دەکەنەوە و سونەت دەمرێنن .

{ البدع لابن وضاح ٦١ }

عبدالله کوڕی عمر دەڵێت :

باشترین ئاین ئاینی محمد { ﷺ } وە خراپترین کردار داهێنراوەکانن
شوێنکەوتە بن وبیدعەچی مەبەن بەهیچ شێوەیەك گومڕا نابن تا
شوێنکەوتەی ئەسەر بن گەر شوێنکەوتەمان بن پێشکەوتنێکی زۆر زۆر
بەدەست دێنن وەئەگەر پیچەوانەمان بکەن ئەوا بەڕاستی بەگومڕایەکی
زۆر گەورە گومڕابوون هیچ ئومەتێك نیە لە دینەکەیدا بیدعە بکات ئیلا
خوای گەورە سونەت وهیدایەتیان لەسەر هەڵدەگرێت، پاشان بەئەبەدی
بۆیان ناگەڕێنێتەوە وە ئەگەر لەگۆشەیەکی مزگەوتدا ئاگرێکی گڕ گرتوو
ببینم زۆر پێم خۆشترە بیدعەیەک ببینم وگۆڕانکاری نەبێت .
{ السنە المروزی ٨١ }

وە دەڵێت : هەموو بیدعەیەک گومڕاییە ئەگەر چی هەموو خەڵکیش
بەباشی بزانن .

عبدالله کوڕی عەمری کوڕی عاص دەڵێت:

هیچ بیدعەیەك نیە دابهێنرێت ئیلا زیاتر بەردەوامی پێ دەدرێت وە هیچ سونەتێکیش نیە لاببرێت ئیلا زیاتر دەڕواو نامێنێت .

{ أصول اعتقاد اللالكائى ٧/٨ }

معاذ کوڕی جبل دەڵێت :

ئەی خەڵکینە هەوڵێ زاست بدەن پێش ئەوەی هەڵبگیرێتەوە هەڵگرتنی نەمانی خاوەنەکانیەتی خۆتان بپارێزن لە بیدعە و داهێنراوەکان و زیادەڕەوی پەیوەست بن بە فەرمانە کۆنەکە { قورئان وسونەت }

{ البدع لابن وضاح ٦٢ }

سفیان الثوری دەڵێت :

بیدعە خۆشەویسترە لەلای شەیتان تا تاوان تاوان تەوبەو گەڕانەوەی لێدەکرێت بەڵام بیدعە تەوبەی لەسەر ناکرێت .

{ أصول اعتقاد اللالكائى ٩/٦ }

عمر کوڕی عبدالعزیز دەڵێت :

سوێند بەالله ئەگەر سونەتێك زیندوو نەکەمەوە وبیدعەیەك نەمرێنم حەزناکەم ساتێک لەژیاندا بژیم وە بەئاواتەوەم لەگەڵ زیندوکردنەوەی سونەتێك ومراندنی بیدعەیەك پارچەیەک لەلاشەم بەخشیبێت لەگەڵیدا .

{ السنه للمروزی ٩٣ }

مالك کوڕی أنس دەڵێت :

هەرکەسێك بیدعەیەك دابهێنێت لەئیسلامدا وبەچاکێ بزانێت ئەوا بەم کارەی وا دەردەبڕێت محمد { ﷺ } خیانەتی لەپەیامەکەی خوای گەورە کردوە لەبەر ئەوەی الله تعالى دەفەرمووێت: [ الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ ] جا ئەوەی ئەو ڕۆژە دین نەبوبێت ئەمڕۆش دین نیە . { المائدة ٣ }

{ الاعتصام للشاطبی ٦٥/١ }

سفیان الثوری دەڵیت :

هەرکەس گوێی لە بیدعەیەك بوو با باسی نەکات لەلای ئەوانەی لای دادەنیشن وە نەیخاتە دڵیانەوە .

{ الحلیة }

ئیمامی مالك دەڵێت :

ئامان وریای بیدعە بن وترا : ئەی باوکی عبدالله بیدعە چیە ؟ فەرمووی : ئەهلی بیدەع ئەوانەن کە قسەدەکەن لەسەر ناوەکانی خوای گەورەو سیفاتەکانی وکەلامەکەی وعیلمەکەی بێدەنگ نابن لەوانەی کە هاوەڵان وتابعین بێدەنگ بوون لێ .

{ السنه البغوی ص٢١٧ }

مەبەستی ئەوانەیە کە بەبێ عیلم قسەدەکەن لەسەر ناو وسیفاتەکانی الله تعالی .

# هەڵوێستی سەلەف بەرامبەر کەسی موبتەدیع

عبد الله کوڕی ئیمام أحمد دەڵێت :

پرسیارم لە باوکم کرد سەبارەت بە پیاوێک کە بیدعە دەکات و دەعوەی بۆ دەکات وە کەسانێکی بانگخوازی هەیە بۆ بیدعەکانی ئایا وای دەبینیت کە بەند بکرێت ؟

فەرمووی : بەڵێ وای دەبینم کە بەند بکرێت و شەڕی بیدعەکانی لە موسوڵمانان لابدرێت .

{ مسائل عبدالله ۱٥۹۰ }

أبي قلابة دەڵێت :

صاحبی بیدعە نوێژیان قەبووڵ نییە وە ڕۆژووشیان قەبوول نییە وە حەج و عومرەو جیهادیشیان قەبوول نییە وە هیچ ڕێزێک و دادوەرییەکیان نییە .

{ الشريعة الآجری ۱٥۷ }

أبو الجوزاء دەڵێت :

لە ماڵەوە دابنیشم لەگەڵ بەراز و مەیمون و هاوەڵێتیان بکەم زۆر پێم خۆشترە لەوەی هاوەڵێتی کەسێك بکەم لە ئەهلی بیدعە .

{ أصول إعتقاد اللالكائي ٢٣١ }

ئیمامی أحمد دەڵێت :

ئەوەی بیستومانە و پێمان گەیشتووە لەسەری لای زانایانی { ئەهلی سونە } پێیان باش نەبووە قسەکردن و دانیشتن لەگەڵ ئەهلی لادەران گومرایاند ئەوان لێتی دەشارنەوەو تێکی دەدەن و ناگەڕێنەوە .

{ مسند إمام أحمد ٩٥/١ }

الحسن البصري دەڵێت :

دامەنیشە لەگەڵ هاوەڵانی هەوا وئارەزوو ئەگەر چی واگومانیش ببەیت کە وەڵامت بۆیان هەیە .

{ ذم الكلام }

ئیمامی اللالكائی دەڵێت :

هیچ تاوانێک بەسەر موسڵمانانداا نەهاتووە بەهێندەی وتووێژو دانیشتن لەگەڵ بیدعەکاراندا ئەوندە زەلیل و بچووك بون کە سەلەف وازیان لێهێناون و ڕوویان لێ وەرچەرخاندوون بەقسەکانیانەوە دەمردن بەداخ و دەردەوە نەیان دەتوانی ئەوەی دەیانەوێت دەری بڕن تاوەکو لەخۆبای بووەکان هاتن درگای دەربڕینیان بۆکردنەوە و بوونە چاوڕۆشن بۆلەناو بردنی ئیسلام تاوەکو زۆر بوو لەنێوانیاندا قسە وتن و گەیشتنە ئەوەی بەرنامەو بۆ چوونەکانیان دەرکەوت گەیشتە گوێی ئەوانەی نەیاندەزانی لەکەسی تایبەتی و گشتی و گومانەکانیان توانی بەرامبەر بە بەڵگە بووەستێت .

{ أصول إعتقاد اللالكائی ١٩/١ }

ابن عباس دەڵێت :

لەگەڵ ئەهلی هەواو ئارەزوو دامەنیشن چونکە دانیشتنەکانیان نەخۆشین بۆ دڵەکان .

{ الشریعە ٤٥٣/١ }

مجاهد دەڵێت :

وترا بە ابن عمر رضي الله عنهما : نجدة ئاوا وئاوا دەڵێت

وای کرد کە ئەوقسانە نەیبیستێ لەبەر ئەوەی پێی ناخۆشبوو شتێك لەو

قسانە بکەوێتە دڵیەوە .

{ اللالكائي }

نجدة : ابن عامری الحنفی ە، کە گەورەی خەواریجەکان بوو.

أبو قلابة دەڵێت :

لەگەڵ ئەهلی هەواو ئارەزوو دامەنیشن وە دەمە دەمیان لەگەڵدا مەکەن

چونکە من لێتان ئەمین نابم لەوەی بتان خەنە ناوگومڕاییەوە یان

چەواشەتان بکەن لەدین لەوشتانەی کەخۆیان پێی چەواشەبون .

{ الشريعه ٤٣٦/١ }

هشام کوڕی حسان دەڵێت:

پیاوێك بە ابن سيرين وت : فڵان کەس دەیەوێت بێت بۆلات وە ئەو باسی هیچ شتێك ناکات

ابن سيرين فەرمووی : بڵی بە فڵان کەس با نەیەت بۆلام چونکە بەڕاستی دڵی بەنی ئادەم لاوازە وە من دەترسم گوێم لە کەلیمەیەك بێت لێوەی دڵم نەگەڕێتەوە سەر ئەوەی کە پێشتر لەسەری بووە .

{ الإبانة الكبرى }

بەناو ئەهلی سونەش ئێستە ئەوەندە لەخۆی ئەمینە شەو ڕۆژ موتابەعەی نوسین وفیدیۆی موبتەدیع وزەندیق ئەکات پاش ماویەک ئەوەندە ئەزانی سەری لەزەندیقەیەوە دەردەچێت بەهۆی ئەو خەم ساردیەی لە گوێگرتن بۆ موبتەدیع وزەندیەقەکان .

إبن سيرين دەڵێت :

پیاوێك هەڵگری بیدعە بێت هەرگیز ناگەڕێتەوە بۆ سونە .

{ الإبانة الصغرى ٨٦ }

حرب الكرمانی دەڵێت :

لەلای علی کوڕی عبدالله باسی هەندێك لە قسەكانیانم كرد { واتە :
جەهمیەكان } وتم : خەڵكانێك ئاوا وئاوا دەڵێن
فەرمووی : ئەگەر پیاوێك ئەم قسانەی باسبكردایە لەلای حماد وغەیری
ئەو لە شێخەكان ئەوا دەریان دەكرد بەبێ ئەوەی هیچ شتێك باسبكات زۆر
زۆر ڕقیان لێی بوە قسەكانیان باسبكرێت

حرب دەڵێ : وتم بە علی : پێیان ناخۆش بووە پیاو باسی قسەكانی ئەهلی
بیدعە بكات ؟
فەرمووی : بەڵێ بەڕاستی من دەترسم باسبكرێت لەلای پیاوێكی دڵ لاواز
وبكەوێتە دڵیەوە !.
{ مسائل حرب }

طلحة بن عمرو دەڵێت :

دامەنیشن لەگەڵ ئەهلی بیدعە چونكە گەڕییان پێوەیە .
{ السنه حرب ٥٩٩ }

حماد کوڕی ابراهیم دەڵێت :

پیاوێك بە حفص کوڕی غیاث وت : ئەی باوکی عمر خەڵکانێك هەن لای ئێمە وا گومان دەبەن کە قورئان مەخلوقە

حفص فەرمووی : ئەی خوای گەورە پاداشتی خێرت نەداتەوە شتێکت خستە دڵمەوە کە هەرگیز نەم بیستبوو !.

{ الإبانة الکبری }

سلام کوڕی أبي مطیع دەڵێت :

پیاوێک لەبیدعەچیەکان بە أیوب السختیانی وت ئەی باوکی بەکر لەبارەی یەک وشەوە پرسیارت لێ ئەکەم ؟

ئەیوبی سختیانی پەنجەی نابەگوێی خۆیەوە وڕۆشت و بەنیو وشەش وەڵامی نەدایەوە .

{ الشریعە ١/٤٤٠ }

محمد بن النضر الحارثي دەڵێت :

هەرکەسێ گوێ ڕابگرێت بۆخاوەن بیدعەیەك وبشزانێت خاوەن بیدعەیەئەوە لەپارێزراوی ڕادەماڵدرێت و ئەدرێتە دەست نەفسی خۆیەوە .

{ اللالكائى ١/١٥٣ }

جا ئەبێت حاڵی ئەو کەسە چۆن بێت بدرێتە دەست نەفسی خۆی ؟!

ابن عون دەڵێت :

ابن سيرين خێراترین کەس بوو لە ڕەدانەوەی بۆ ئەهلی بیدەع وە وای دەبینی ئەم ئایەتە لەسەر ئەوان دابەزیوە : { وَإِذَا رَأَيْتَ الَّذِينَ يَخُوضُونَ فِي آيَاتِنَا فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ } { الأنعام ٦٨ } واتە : کاتێك ئەوانەت بینی لە ئایەتەکانی ئێمە ڕۆدەچن ودەمە دەمێ دەکەن ئەواتۆ پشتیان تێبکە وبەجێیان بهێڵە .

{ الإبانة الكبرى ٥٧٧ }

سفيان الثوري دەڵێت :

هەرکەسێک لەگەڵ بیدعەچییەک دابنیشێت سەلامەت نابێت لە یەکێك لەم سیانە

١ یان دەبێتە فیتنە { مایەی گومڕای } بۆ کەسێکی تر .

٢ یان شتێک دەکەوێتە دڵیەوە بەهۆیەوە پێی هەڵ دەخلیسکێت وجا اللەش دەیخاتە ئاگرەوە .

٣ یان دەڵێت : سوێن بە الله من گوێ بەقسەیان نادەم من متمانەم بەخۆمە ! جا هەرکەسێک چاو تروکاندنێک ئەمین بوو لە سەر دینەکەی الله لێی وەر دەگرێتەوە .

{ البدع والنهيلابن وضاح ص٥٤ }

زۆربەی ئەوانەی کە نوسین وفیدیۆی ئەهلی بیدەع و زەنادیقەکان موتابەعە دەکەن خاڵێ سێیەم قسەیانە .

ئیمامی الآجري دەربارەی هەجرکردنی بیدعەچی و ئەهلی هەوا و ئارەزوو دەڵێت :

ئەگەر بڵێن : ئایا وازیان لێ بهێنین بە باتڵی خۆیانەوە قسە بکەن و ئێمەش لێیان بێدەنگ بین و ڕەدیان نەدەینەوە ؟

لە وەڵامدا دەگوترێت : بێدەنگ بوونت لێیان وهەجرکردنیان لەوشتانەی کە دەیڵێن زۆر قورسترە لەسەریان لەوەی مونازەرەیان بکەیت و بە قسە ڕووبەڕوویان ببیتەوە

دواتریش دەڵێت : پێشینە چاکەکان و زانایانی موسڵمانان لە پێشوو هەر ئاوایان فەرمووە .

{ الشريعه ٤٤٩/١ }

جا تۆش لەمامەڵەت لەگەڵ ئەهلی بیدەع دا شوێن سەلەف وموسڵمانان بکەوە .

طلحه کوڕی خصیف دەڵێت :

شایەدم لە تەورات دا هاتوبوو : ئەی موسا دەمە دەمێ وموجادەلە لەگەڵ ئەهلی بیدەعدا مەکە شتێك دەخەنە دڵتەوەو دوای دەچیتە ئاگرەوە .

{ الابانه الكبرى ٥٨٠ }

أبو قلابه دەڵێت :

لەگەڵ ئەهلی بیدەعدا دامەنیشن وە مناقەشەیان لەگەڵدا مەکەن چونکە من لێتان ئەمین نابم لەوەی کەتوشی گومڕایەکەی خۆیانتان بکەن یان چەواشەتان بکەن لەوەی کە دەیزانن .

{ سنن الدارمی ٣٩١ }

فضیل کوڕی عیاض دەڵێت :

دامەنیشە لەگەڵ خاوەنی بیدعەدا من دەترسم لەعنەت داباریێتە سەرت .

{ الإبانه الكبرى ٤٦٩ }

إبراهيم النخعى دەڵێت :

لەگەڵ ئەهلی بیدەع دا دامەنیشن چونکە دانیشتن لەگەڵیان ڕوناکی ئیمان لەدڵ دەبات وەجوانی دەم و چاو ناهێڵێت وە ڕق بون لەباوەڕداران دەخاتە دڵتەوە .

{ الابانە الكبرى ٤٣٩/٢ }

إسماعيل الطوسى دەڵێت :

ابن المبارك پێی وتم : با دانیشتننت لەگەڵ هەژاران بێت وە ئاگات وریابە لەوەی لەگەڵ ساحیبی بیدعە دابنیشیت . { الابانە الكبرى ٤٧٩ }

مقاتل کوڕی محمد دەڵێت :

عبد الرحمن بن مهدي بەمنی وت : ئەی باوکی حەسەن لەگەڵ ئەوانە دامەنیشە کە خاوەن بیدعەن ئەوانە لە شتێکدا فەتوا دەدەن کە مەلائیکەتەکانیش دەستەوسان دەبن تیایدا .

{ الابانە الكبرى ٤٨٣ }

عبد الله کوڕی محمد کوڕی الفضل الصیداوي دەڵێت :

ئیمام ئەحمەد پێی وتم : ئەگەر مسوڵمانێ سەلامی کرد لە موبتەدیعێک ئەوا خۆشی ویستوە چونکە رسول الله { ﷺ } فەرموو : ئاگادارتان کەم لەکارێ گەر ئەنجامی بدەن یەکترتان خۆشبوێت ؟ سلام بکەن لەیەکتری و بڵاوی بکەنەوە لەنێوان خۆتان .

{ الآداب الشرعية ٢٥١/١ }

ئیمام أحمد دەڵێت :

گۆڕی ئەهلی سونە لەوانەی تاوانی گەورەیان ئەنجام داوە باخاتە گۆڕی ئەهلی بیدعەی لەوانەی تاوانیان نەبوە و زۆر عیبادەت کاربوون دۆڵێکە لە ئاگر فاسقەکان وتاوانبارانی ئەهلی سونە ئەولیایی اللەن عیبادەت کاران وزاهیدانی ئەهلی بیدعە دوژمنی اللەن .

{ طبقات الحنابلە ١٨٤/١ }

ابن هانئ دەڵێت :

پرسیارم کرد لە باوکی عبدالله ئیمام أحمد دەربارەی پیاوێکی موبتەدیع بانگخوازی دەکات بۆ بیدعە ئایا دانیشین لەگەڵی ؟

ئیمامی أحمد فەرمووی : نەخێر قسەشی لەگەڵ ناکەی بۆئەوەی بگەڕێتەوە .

{ مسائل ابن هانئ }

ئیمامی ابن بطة دەڵێت :

با هیچ کەسێك لەئێوە گومانی باشی بەخۆی نەبێت بەوەی کەدەزانێت لەراست و دروستی بۆچوونەکەی ببێتە هۆکاری خۆ خستنە ترسناکی بەدینەکەیەوە بەرێگەی دانیشتن لەگەڵ هەندێ لە بیدعەکاراندا .

{ الابانە الکبری ٢/٤٦٩ }

وریابە وسەرکەشی مەکە بەدینەکەتەوە بەرێگەی خویندنەوەی نوسرا وکتێبەکانی ئەهلی بیدعە .

ئیمامی أحمد دەڵێت :

ئەگەر کەسێک خاوەنی بیدعە بێت و لێی دەرکەوتبێت یان تاوان و سەرپێچییەکەی ئاشکرا بووبێت ئەوا غەیبەتی نییە .

{ المسائل حرب ١٤٠٥ }

فضیل کوڕی عیاض دەڵێت :

ساحێبی بیدعە لێی ئەمین مەبە لەسەر دینەکەت وە پرس و ڕاوێژی پێمەکە لە کار و کردەوەکانتدا وە لەگەڵیدا دامەنیشە وە هەرکەسێک دابنێشێت لەگەڵ ساحێبی بیدعە الله تعالی کوێری پێدەدا واتا ( لە دڵیدا ) .

{ الابانه الكبرى ٤٦٩ }

مسلم کوڕی یسار دەڵێت :

گوێ مەگرە بۆ ساحێبی بیدعە دوای توشی شتێکت دەکا کە ناتوانی دەری بکەیت لەدڵ .

{ الابانه الکبری ٤٦٨ }

ابن مندە دەڵێت :

دوو جار تەواوی ڕۆژ هەڵات و ڕۆژ ئاوە گەڕام نە لە کەسانی ڕاڕا نزیک بومەوە تەنها فەرموودەیەکەیشم لە بیدعەچی نەبیست و وەر نەگرت .

{ طبقات الحنابلة ١٦٧/٢ }

إبن سيرين دەڵێت :

هیچ پیاوێك نیە بیدعەیەك دابهێنێت پاشان بگەڕێتەوە بۆ سونەت !.

{ سنن الدارمی ٢٠٨ }

واتە : هەرگییز ناگەڕێتەوە بۆ سونەت ئیلا لە بیدعەیەکەوە ئەچێت بۆ بیدعەیەکی لەو خراپتر !

فضيل كوڕی عياض دەڵێت :

هەر كەسێک خاوەن بیدعەی خۆش بوێت خودای گەورە كردەوەكانی پوچەڵدەكات وە نور و ڕوناكی ئیسلامی لەدڵ دەردەهێنێ .

{ الابانه الكبرى ٤٦٩ }

[ يَوْمَ تَبْيَضُّ وُجُوهٌ وَتَسْوَدُّ وُجُوهٌ ] { ال عمران ١٠٦ }

ابن عباس دەڵێت : دەموچاوی ئەهلی سونەو یەك پارچەی سپە دەبێت وە دەموچاوی ئەهلی بیدەع وتەفرەقە ڕەش دەبێت .

{ جامع البيان ٩٣/٧ }

ابن عمر :

كاتێک پرسیاری قەدەریەكانی لێكرا فەرمووی : ئەگەر بەیەكێك لەوانە گەیشتیت پێیان ڕابگەیێنە كە ابن عمر لەوان بەریەو ئەوانیش لە ابن عمر بەرین سێ جار .

{ أصول اعتقاد اللالكائى ص٥٨٨ }

أيوب السختياني دەڵێت :

هیچ ساحێبی بیدعەیەك نیە عیبادەتەكانی زیاد بكات ئیلا الله تعالى زیاتر دووورى دەخاتەوە .

{ تلبيس ابليس ص١٨ }

فضيل كوڕى عياض دەڵێت :

هەر كەسێك كچەكەی بەشوو بدات بە موبتەدیعێك، ئەوا بەڕاستی سیلەی ڕەحمی لەگەڵ پچڕاندوە .

{ أصول اعتقاد اللالكائي ص٧٣٣ }

إبراهيم النخعي دەڵێت :

ساحێبی بیدعە غەیبەتی نیە .

{ أصول اعتقاد اللالكائي ص٦٧ }

فضيل كوڕی عياض دەڵێت :

پێم خۆشە لەنێوان من وساحێبی بیدعە قەڵایەك لەئاسن هەبێت لەلای جولەكەو گاور خواردن بخۆم زۆر پێم خۆشترە لەوەی لای ساحێبی بیدعە بیخۆم .

{ أصول اعتقاد اللالكائی ص٦٣٨ }

يحيى كوڕی أبی كثير دەڵێت :

ئەگەر لەڕێگایەكدا بویت وبە بیدعەچیەك گەیشتیت ئەوا تۆ برۆ ڕێگایەكی تر بگرە .

{ البدع لابن وضاح ص٤٨ }

ئیمامی الأوزاعی دەڵێت :

هەندێك لە ئەهلی عیلم دەیان وت : الله تعالى نە نوێژ و نەڕۆژو و نەخێر و نە جیهاد و نە حەج و نە عومرە لە خاوەن بیدعە قبوڵ ناكات .

{ الاعتصام للشاطبی }

ابن ابی حاتم الرازی دەڵێت :

گوێم لەباوكم و أبا زرعه بوو فەرمانیان دەكرد بەهەجركردنی ئەهلی بیدەع ولادەران زۆر زۆر توند بوون لەسەر ئەمە وە ئینكاریان دەكرد لەوەی كتێب دابنرێت بە ڕاو بۆچون بەبێ ئەوەی ئاساری تێدابێت وە ڕێگریان دەكرد لە دانیشتن لەگەڵ ئەهلی كەلام وە سەیركردنی كتێبی ئەهلی كەلام وە دەیان فەرموو : هەرگیز خاوەنی كەلام سەركەوتوو نابێت .

{ أصول اعتقاد اللالكائی ص١٧٩ }

فضیل كوڕی عیاض دەڵێت :

هەركەسێك خاوەن بیدعەیك بەگەورە بزانێت ئەوا بەڕاستی یارمەتی داوە لەسەر ڕوخاندنی ئیسلام وە هەر كەسێك پێبكەنێت بەدەم خاوەن بیدعەیەكەوە ئەوا بەڕاستی ئەوەی بەسووك زانیوە كە الله تعالی دای بەزاندوە بۆ سەر محمد { ﷺ } .

{ الامر بلاتباع ص٧٨ }

ئیمامی الأوزاعي دەڵێت :

پێم گەیشتوە کەهەرکەسێك بیدعەیەکی گومڕای بکات شەیطان دڵی نەرم دەکات لەعیبادەتدا یان خشوع و گریانی تێدا دەخات تاکو ڕاوی خەڵکی پێ بکات .

{ الاعتصام للشاطبی ١/١٦٥ }

فضیل کوڕی عیاض دەڵێت :

ئەگەر الله تعالی بزانێت پیاوێك ڕقی لە ئەهلی بیدعەعە، ئەوا من ئومێدم وایە الله لێی خۆشببێت ئەگەر چی عەمەل و کرداریشی کەمبێت .

{ الطیوریات ٤٣٨ }

أسد کوڕی موسی دەڵێت :

ئامان وریابە لەوەی لەگەڵ ئەهلی بیدعەدا ببیتە برا یان لەگەڵیان دابنیشیت یان ببیتە هاوەڵیان .

{ البدع لابن وضاح ١٠ }

مفضل کوڕی مهلهل دەڵێت :

گەر لەگەڵ بیدعەکاردا دانیشتبای یەکسەر باسی بیدعەکەی خۆی بۆت بکردایە ئەوا لێی وریا دەبویتەوە و لێی دوور دەکەوتیتەوە، بەڵام لە پێشدا باسی سونەتت بۆ دەکات دوای بیدعەی تێکەڵ دەکات!! جا لەوانەیە دڵت وەری بگرێت جا ئەگەر وەری گرت کەی لە دڵت دەردەچێت ؟!!

{ الإبانة الکبری ٢/٤٤٤ }

ئەگەر لە تۆڕە کۆمەڵایەتیەکان خەوارج و مورجیئە و جەهمیت لایەو سونەت پۆست دەکەن و ئیدعای سەلەف دەکەن بلۆکیان بکە و هەڵمەغەڵەتێ بە تۆزێک هەنگوینی پڕ لەژەهر ئەوان لێتی ئەشارنەوەو لێتی تێک ئەدەن وریای عەقیدەکەت بەو بپارێزە ئەگەر بیدعەکەی وەربگرێت دەرچونی لەدڵت زۆر زەحمەتو ئەستەمە .

## هەڵوێستی سەلەف لەسەر ئەو کەسەی لای موبتەدیع دادەنیشێت

عبدالله کوڕی عون دەڵێت :

هەرکەسێك لەگەڵ ئەهلی بیدەع دابنیشێت قورسترە لەسەرمان وەك لە ئەهلی بیدەع .

{ الابانة الکبری ٥١٣ }

عمرو کوڕی قیس الملائی دەڵێت :

ئەگەر گەنجێکت بینی لەوکاتەی کە پێدەگات لەگەڵ ئەهلی سونە وجەماعە دا بوو ئەوا ئومێدت پێی هەبێت وە ئەگەر بینیشت لەگەڵ ئەهلی بیدەع دا بوو ئەوا بێ ئومێد ببە لێی چونکە گەنج لەسەر ئەوەیە کە لەسەری پێگەشتوە .

{ الابانه الکبری ٥٤٣ }

أبی قلابه :

پیاوێکی ئەهلی سونەی بینی لەگەڵ پیاوێکی ئەهلی بیدەع دا بوو أبی قلابه پێی وت : ئەوە چیت لەگەڵە ؟! ئەمە گاڵتە پێکردنە گاڵتە پێکردن .

{ الابانه الكبری }

ئیمامی أبو داود دەڵێت :

وتم بە ئیمام أحمد پیاوێک دەبینم لە ئەهلی سونە لەگەڵ ئەهلی بیدەع ئایا قسەی لەگەڵ داببڕم ؟

فەرمووی : نەخێر : پێی بڵێ ئەوەی لەگەڵی قسە دەکەی ئەهلی بیدەعە واتە ئاگاداری بکەوە لێی ئەگەر قسەکردن لەگەڵی تەرک کرد باشە گەر نا تەرکی بکە ابن مسعود دەی فەرموو : هەرکەس بەپێی هاوڕێکەی هەڵدەسەنگێندرێت .

{ طبقات الحنابله ١/٤٢٩ }

ئیمای ابن بطة دەڵێت :

لە سوننەت دوورکەوتنەوەیە لە هەموو کەسێک باوەڕی بە یەکێک لەو شتانە هەبێت کە باسمان کردن

{ واتە بیدعەکان } وە هەجر کردنیان و ڕق لێبوونەوەیان وە هەجر کردنی کەسێک خۆشی بوێن و سەریان بخات و بەرگریان لێ بکات و هاوەڵێتیان بکات گەر چی ئەو بکەرە دەرخەری سوننەتیش بێت .

{ الابانة الکبری ٢٨٢ }

إبراهیم کوڕی میسرة دەڵێت :

هەر کەسێ ڕێز لە خاوەن بیدعەیەك بگرێت ئەوە یارمەتی ڕوخاندنی ئیسلامی داوە .

{ اللالكائي ٢٧٣ }

به حسن البصری ووترا :

فلان كەس جەنازەیەكی شۆردوە كە ئەهلی بیدەع بووە

فەرمووی: بیناسنەوە كەمرد ئێمەش نوێژی لەسەر ناكەین

{ الابانه الصغری ٢٠٠ }

فضیل كوڕی عیاض دەڵێت :

هەر كەسێک شوێن جەنازەی موبتەدیعێك بكەوێت لە تورەی الله دا دەبێت هەتا دەگەڕێتەوە .

{ الابانه الصغری ١٩٤ }

الزبرقان السراج دەڵێت :

شقیق پێی وتم : دامەنیشە لەگەڵ هاوەڵانی : پێم وایە و وام پێباشە ( واتە : ئەهلی ڕەئی ) .

{ الابانه الكبری ٤٤٧ }

یونس کوڕی عبید :

کوڕەکەی بۆی باسکرد کە دانیشتوە لەگەڵ { عمرو بن عبید } هاتبوو بۆلای باوکی تا عوزر بهێنێتەوە بۆ ئەو کارەی یونس کوڕی عبید پێی فەرموو : ئەی کوڕەکەم ڕێگریم لێکردی لەوەی زینا بکەیت ودزی بکەیت ومەشروب بخۆیت بەڵام ئەگەر بگەڕێیتەوە بۆلای الله تعالى بەم کارانەوە زۆر پێم خۆشترە لەوەی بگەڕێیتەوە بە ڕای { عمرو وهاوەڵاکانی عمرو } .

{ أصول اعتقاد اللالكائي ص٧٤١ }

عمرو بن عبید : یەکێکە لەسەرانی موعتەزیلەو دەعوەی بۆ بیدعەکەی کردوە .

وترا بە ئیمای الأوزاعي :

پیاوێک هەیە دەڵێت : من لەگەڵ ئەهلی سونەش دادەنیشم و لەگەڵ ئەهلی بیدەعیش

ئیمامی الأوزاعي فەرمووی : ئەمە پیاوێکە دەیەوێت حەق و بەتاڵ یەکسان بکات .

{ الابانه الصغرى ٤٦٢ }

حنبل کوڕی إسحاق دەڵێت :

پیاوێك نامەیەکی نوسی بۆ باوکی عبدالله ئیمام أحمد نامەیەك بوو تێیدا که ئیزنی بدات کتێبێك دابنێت ڕەدی ئەهلی بیدەع بداتەوەو لەگەڵ ئەهلی کەلام دابنیشێت ومونازەرەیان لەگەڵدا بکات و بەڵگەیان بۆ بهێنێتەوە

ئیمام أحمد بۆی نوسی : بسم الله الرحمن الرحيم خوای گەورە عاقیبەتت خێر بکات وە بتپارێزێت لە هەموو خراپەیەک و مەترسی دارێك ئەوەی ئێمە گوێ بیستی بوین و پێی گەیشتوین لەوەی ئەهلی عیلم پێی گەیشتون ئەوەیە : ئەوان ڕقیان لە عیلمی کەلام بوە وە دانیشتن لەگەڵ ئەهلی بیدەع ولادەران وە هەموو کارەکان لە تەسلیم بوندایە وە کۆتای لە کتێبی خوای گەورە و سونەتی رسول الله { ﷺ } دایە نەک لەگەڵ دانیشتن لەگەڵ ئەهلی بیدەع و لادەران بۆ ڕەدانەوەیان چونکە ئەوان لێتی ئەشارنەوەو تێکی ئەدەن وە هەرگیز ناش گەڕێنەوە ( بۆ حەق ) وە بەڕاستی سەلامەتی لەوەدایە واز لە دانیشتن و دەمە دەمێ کردن بهێنیت لەگەڵیان لە بیدعە وگومڕایەکانیان .

{ أصول اعتقاد اللالكائى ١/١٩ }

عبدالله الصيداوي دەڵێت :

ئیمام أحمد پێی ووتم : گەر کەسێک سەلام بکات لە موبتەدیعێك ئەوا خۆشی ئەوێت چونکە پێغەمبەر { ﷺ } فەرموویەتی : ( ئایا شتێکتان پێ نەڵێم گەر ئەنجامی بدەن بەهۆیەوە یەکترتان خۆشبوێت ؟ سەلام بڵاوبکەنەوە لە نێوانتاندا ) .

{ طبقات الحنابلة ٤٧/٢ }

الحمدلله الذي بنعمته تتم الصالحات نسأل الله القبول والاخلاص .

